زنجیرەی چیرۆکی پێغەمبەران

# یونس پێغەمبەر

سەلامی خوای لێبێت





زنجیرەی چیرۆکی پێغەمبەران

# یونس پێغەمبەر

## سەلامی خوای لێبێت

بسم الله الرحمن الرحیم

ناوی نامیلکە: یونس پێغەمبەر

(سەلامی خوای لێبێت)

ئامادەکردنی: محمد عەلی قەرەداغی

چاپ و دیزاین: ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

تیراژ: ( ٢٠٠٠) دانە

نرخ: ( ١٥٠٠) دینار

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارەی سپاردنی ( ١٧٦٧) ی ساڵی ٢٠١١ی پێدراوە

ARA Media Center

ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

لەعێراقی کۆندا شارێك بوە ناوی (نەینەوا) بوە، خەڵکەکەی
کە ( ١٢٠٠٠٠ ) صەدو بیست هەزار کەس بوون بتیان
دەپەرست، خودا حەزرەتی یونسی نارد بۆ ناویان تا بانگیان
بکا بۆ خوداپەرستیی و دەسبەرداربوون لە بتپەرستیی.
یونس عليه السلام هەر خەریکی بانگکردنی گەلەکە بوو بۆ
خوداپەرستیی و وازهێنان لە بێباوەڕیی و کەللەڕەقیی. بەڵام
کەس گوێیی بۆ نەگرت و باوەڕیان پێ نەکرد. یونس عليه السلام
لەوە زۆر تووڕە بوو و هەڕەشەی سزای سەختی خودای
لێکردن.



کاتێ یونس عليه‌السلام لە گەلەکەی هیوا بڕاوبوو زانی باوەڕی پێ ناهێنن، گوندەکەی بەجێ هێشت و چاوەڕێی ئەوەی نەکرد کە بزانێ گوندەکە چی بەسەر دێت و، چوو بۆ کەناری دەریا، لەوێ کەشتییەکی بینی خەڵکێکی زۆر سواری بووبوون، ئەویش لەگەڵیان سوار بوو.





کەشتییەکە کەوتە ڕێ کاتێ گەییە قووڵایی دەریا خودا بایەکی بەهێزی نارد کەشتییەکەی خستە هەڵبەزو دابەزو بە دەم شەپۆلی ئاوەوە دەهات و دەچوو. کەسانی ناو کەشتییەکە لێیان سوور بوو کە دەخنکێن. بیریان لە سووککردنی باری کەشتییەکە کردەوە، هەرچی کۆڵ و باریان بوو فڕێیانداییە ناو دەریاکە.

کاتێ شەپۆلی دەریاکە نەنیشتەوەو هەر لە چەپۆکاندا بوو، بڕیاریان دا یەکێك لە سەرنشینانی کەشتییەکە بخەنە ناو ئاوەکە تا بەوە باری کەشتییەکە سووکتر ببێت. بۆ ئەمەیش تیروپشکیان لەناو خۆیاندا کرد. تیروپشك بۆ یونس دەرچوو. بەڵام لەبەرئەوەی یونسیان بە پیاوچاك هاتە بەرچاو نەیانخستە ئاوەکەو جارێکی دی تیروپشکیان کردەوە، دیسان هەر بۆ یونس دەرچوو. چەند جار ئەوەیان کرد هەر بۆ یونس دەرچوو. ئەنجام یونس عليه السلام خۆی فڕێدایە دەریاکە بۆ ئەوەی سەرنشینانی کەشتییەکە ڕزگار بن.



خودای گەورە فەرمانیدا بە نەهەنگێك (ماسییەکی
گەورە) کە یونس لووش بدا، بەڵام لەسکیدا
ئازاری پێ نەگەیەنێ.



یونس عليه‌السلام وای زانی مردوە، کە خۆی جوولاند بینی ئەجوولێ و ماوە، لەسکی ماسییەکەدا سوجدەی بردو سوپاسی خودای کردو بۆی دەرکەوت هەڵەی کردوە لەوەدا بەبێ فەرمانی خودا گەلەکەی و شارەکەیانی بەجێ هێشتوە. یونس عليه‌السلام ماوەیەکی زۆر لەسکی نەهەنگەکەدا مایەوەو لەناو سکیدا لەقوولایی دەریادا یادی خودای دەکردو سوبحانەڵلای دەکرد.





لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ

یونس ﷺ پەشیمان بوەوە لەو کردەوەیی و داوای لێخۆشبوونی لەخودا کرد، لەسکی ماسییەکەدا بەردەوام دەیوت: ﴿لَّا إِلَهَ إِلَّا أَنتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ الظَّالِمِينَ﴾ خوایە لە تۆ زیاتر خوایەکی تر نییە، پاك و بێوێنەی، من لە ستەمکاران بووم. خودا فەرمانیدا بەنەهەنگەکە کە یونس فڕێ بداتەوە کەناری دەریاکە.





یونس ﷵ لەسکی ماسییەکە چوە دەرەوە ڕووت و قووت و لاوازو بێ هێز، خودا بنجێك کوولەکەی گەڵاپانی لەکەناری دەریاکەدا بۆ ڕوان، یونس ﷵ لەژێر گەڵاکەیدا خۆی حەشارداو، لە بەرەکەی دەخوارد. ماوەیەك وەها مایەوە تا هێزی هاتەوە بەرو، وەك خۆی لێ هاتەوە. دوای ئەوە گەڕایەوە بۆلای گەلەکەی و نەیدەزانی کە خەڵکی نەینەوا دوای ئەو پەشیمان بوونەتەوەو گەڕاونەتەوەو تەوبەیان کردوە.



کاتێ یونس (عليه السلام) گەڕایەوە بۆ لای گەلەکەی
بەخۆشییەوە پێشوازییان کردو یونسیش (عليه السلام)
هەواڵی ئەوەی دانێ کە خودا تەوبەکەی
قوبووڵ کردوون و لێیان خۆش بووە،
گەلەکەی بەوە ئەوەندەی تر دڵخۆش بوون و
دەورەیان لە یونس دا تا فێری دینیان بکات.

